# سوودەکانی
# هاوڕێیەتی پیاوچاکان

**ئامادەکردن و وەرگێڕانی**

**حەمزە بەرزنجی**

**لەڕێی خوادا دەبەخشرێ و نافرۆشرێت**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

ه:

١-بەو كەسانەی گوێ لە هەموو وتەیەك دەگرن و شوێن چاكەكانی دەكەون.

٢- گەنجە خۆگرە دامەزراوەكان. كە چواردەوریان تەنراوە بە هۆكاری لە خشتە بردن.

٣- دایكو باوكانی بەغیرەت. ئەوانەیان كە بە تەنگ پەروەردەی راست و دروستی منداڵەكانیانەوەن.

٤-بەو موسڵمانە بە ورانەی بونەتە چراو چوار دەوری خۆیان رووناك دەكەنەوە.

## دەستپێك

لــەم زەمانــەدا هــاوڕێ گــەورەترین و کاریگــەرترین فاکتەرو هۆکارە بۆ بەرەو خراپ ڕاکێشان و گومڕاکردنی تاك و کۆمـەڵگای موسڵمانان. چـەندان گـەنجی بانگخواز بوونە قۆچی قوربانی دەستی هاوڕێ و هـاودەمی خـراپ. چـەندین کـەس بـەم هۆیـەوە بووەتـە ئەسـیری نـەفس و شـوێن کەوتـەی ئارەزووی خـۆی و شـەوان لـەناو (باڕ) و بــەڕۆژیش لەشــوێنە تێکــەڵاوی و پــڕ لەخراپی یەکانــدا بەسەر دەبات و هـەروەك گورگی برسـی عەودالـە بـەدوای ناموســی خــەڵك دا. هــەر هاوڕێیــە ئــەو هــەموو گەنجــەی خســـتە داوی ئـــارەق خواردنـــەوەو جگەرەکێشـــان و زینــاکردن لەشــوێنە چــۆڵەکانی لاپــەڕەی شــارو بــەناو (بەهەشـتی شـار) و پارکەکانـدا.. هـەر هـاوڕێ بـوو ئـەو هەموو گەنجانەی کەبووبونە (کۆتری باڵ سپی مزگەوت) کردنی بەساقی مەیخانەو ئێشك چی شوێنە حەرامەکان.

هــەر هــاوڕێ بــوو ئــەو هــەموو گەنجــە بەشــەرم و بــە حەیایەی ڕووت کردەوەو بەرگ و پۆشاکی ئیسلامەتی و کوردایەتی لەبەردا ماڵین..

لەبەر ئەمەیە ئیسلام زۆر گرنگی دەدات بەهاوڕێو مەبەستێکی کەموسڵمان چاوکراوەو بەرچاو روون بێت لە هەڵبژاردنی هاوڕێ داو وەك هەنگ هەردەم هاوڕێیەکی هەنگوین دروست کەران بکاتو دوور بکەوێتەوە لەهاوڕێیەتیکردنی مێشو مەگەزی کەوتوی سەر زبڵدانو شوێنە پیسەکان. چونکە ئەوکات لە قیامەتدا دەستی پەشیمانی دەگەزێو پەشیمانیش دادی نادات.

خوای پەروەردەگار دەفەرموێت: (وَيَوْمَ يَعَضُّ الظَّالِمُ عَلَى يَدَيْهِ يَقُولُ يَا لَيْتَنِي اتَّخَذْتُ مَعَ الرَّسُولِ سَبِيلاً، يَا وَيْلَتَى لَيْتَنِي لَمْ أَتَّخِذْ فُلاناً خَلِيلاً، لَقَدْ أَضَلَّنِي عَنِ الذِّكْرِ بَعْدَ إِذْ جَاءَنِي وَكَانَ الشَّيْطَانُ لِلْإِنْسَانِ خَذُولاً) (الفرقان:٢٧-٢٩).

واتە: لەڕۆژی دوایی‌دا ستەمکار قەپ دەکات بەهەردوو دەستی داو دەڵێ: خۆزگە لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) ڕێگام بگرتایە. ماڵ وێران خۆم خۆزگە فلانە کەسم نەکردایەتە هاوڕێ.

بەڕاستی لەڕێگای ئیمان هێنان بەقورئان گومڕای کردم دوای ئەوەی بۆم هاتو لەڕێ لای دام. وە بەڕاستی شەیتانیش ریسواکەری ئینسانە.

ئیمامی سیوطی لەتەفسیرەکەیدا (٦/٢٥٠) دەربارەی هۆی دابەزینی ئەم ئایەتانە ئەسەرێك لەابن عباسەوە دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت سەنەدەکەی صەحیحە: کەوا ئەم ئایەتە لەسەر عوقبەی کوڕی ئەبی معیط دابەزیوە کاتێ موسڵمان بوو پاشان وازی لەئیسلام هێنا لەبەر خاتری دڵ راگرتنی هاوڕێیەکی کافری کە لەسەفەردا بوو لەشام. جا کاتێ گەڕایەوە لەعوقبە تووڕە بوو کەموسڵمان بوبوو. ئەویش دڵی نەشکاندو کافر بویەوە.

جا وەك ابن کثیر دەفەرموێت: هەرچەند هۆکاری دابەزینی لەسەر عوقبەی کوڕی ئەبی معیط بێت یان غەیری ئەو لەچارە رەشەکان. ئەوا ئەم ئایەتە گشتیەیەو هەموو ستەمکارێك دەگرێتەوە. تفسیر ابن کثیر ٦/١١٦.

پێغەمبەری خواش(ﷺ) دەفەرموێت: (إنما مثل الجليس الصالح والجليس السوء كحامل المسك ونافخ الكير. فحامل المسك إما أن يحذيك، وإما أن تبتاع منه. وإما أن

تجد منه ريحا طيبة. ونافخ الكير إما أن يحرق ثيابك، وإما أن تجد منه ريحا خبيثة) رواه البخاري (٢١٠١) ومسلم (٢٦٢٨) واللفظ له.

واته: نمونەی هاوڕێو هاودەمی چاكو هاوڕێی خراپ وەك عەتر فرۆشو موشەدەمەكەرو ئاسنگەر وایە. جا عەتر فرۆشەكە یان بەشت دەدات یان لێی دەكڕیت. یان لانی كەم بەهاوڕێیەتیكردنی بۆنی خۆش دێت بەسەرتدا. وە موشەدەمەكاریش یان كراسو پۆشاكەكەت دەسوتێنێ یاخود بۆنی ناخۆش دەكات بەسەرتدا.

جا لەبەر گرنگی ئەم باسەو پێم باش بوو زنجیرەی (پەروەردەی ئسلامی) ئەمجارە بەم بابەتە دەست پێ بكات. كەتیایدا باس لەبەرهەمو سودەكانی هاوڕێیەتی كردنی چاكەكارو زیانەكانی هاوڕێی خراپ دەكات. بەئومێدی ئەوەی هەریەك لەئێمە تەماشایەكی خۆمان بكەینو بزانین كێ هاوڕێمانەو كێ شیاوی ئەوەیە كاتە گەوهەرییەكانی خۆمانی لەگەڵدا بەسەربەرین. چونكە وەك پیرەمێردی شاعیر دەفەرموێت:

تاڵو شیرین پێكەوە نەمدیوە چابێ چا نەبێ

هەر كەس هامنشینی چا نەبوو، بێت چا نەبێ

## سوودو بەروبومەکانی هاوڕێیەتی پیاوچاکان

١-ئەو کەسەی لەمەجلیسی پیاوچاکاندا دادەنیشێ خێرێکی گەورەی دەستگیر دەبێت گەرچی بەکردەوەش وەك ئەوانیش نەبێت، ئەویش لەم فەرمودەیەدا دەردەکەوێت کەپێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: (خوای گەورە کۆمەڵە مەلائیکەتێکی هەیە کەبەناو ڕێگاکاندا دەگەڕێت و بەدوای ئەهلی زیکردا عەودالْن. کاتێ کۆمەڵێك دەبیننەوە کەخەریکی یادی خوای گەورەن بانگ لەیەك دەکەن:

وەرن بۆ ئەو شتەی بەدوایدا دەگەڕان. جا بە باڵەکانیان تا ئاسمان دەوریان دەدەن. پاش ئەوەی گەڕانەوە بۆ لای خوای پەروەردگار لێیان دەپرسێ - لە کاتێکدا خوای گەورە زانایە بەحاڵیان- :.. بەندەکانم چیان دەوت؟ دەفەرموون: پەروەردگار خەریکی تەسبیحات و بەگەورە دانان و سوپاس و ستایش کردنی تۆ بوون.. .. جا لە کۆتایی فەرموودەکەدا دەفەرموێت:

(( خوای گەورە دەفەرموێت: (فأشهدكم أني قد غفرت لهم) واتە: دەسا دەتانکەم بەشاهید کە هەموویان خۆش

بووم. مەلائیکەتەکان دەفەرمون: خوایە فلآنە کەسیان تێدایە لەوان نییە بەڵکو بەپێویستی یەك ڕێی کەوتە ناویان. لەریوایەتێکی تردا: فلآنە عەبدی گوناهباریان تێدایە بەلایاندا تێپەڕیو لەگەڵیان دانیشت. خوای گەورەش دەفەرموێت: ئەوانە کەسانێکن ئەوەی لەگەڵیان دانیشێت بێ بەش و بەدبەخت نابێت. لە لەفزێکیدا: (له غفرت هم القوم لايشقى بهم جلسهم) واتە: لەویش خۆش بووم ئەوانە کەسانێکن ئەوەی لەگەڵیان دانیشێ بەدبەخت و نائومێد نابێت)). رواه البخاري (٦٤٠٨) ومسلم (٢٦٨٩).

٢-هاوڕێ کاریگەری هەیە لەسەر کردارو رەوشت و هەڵسوکەوتی مرۆڤ. لەبەرئەوە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: (المرء على دين خليله فلينظر أحدكم من يخالل) رواه أبوداود والترمذي (٢٣٧٨) واحمد والبغوي وحسنه الترمذي والبغوي والالباني في الصحيحة رقم (٩٢٧) وصحح اسناده النووي في رياض الصالحين رقم (٣٧١).

واتە: هەموو کەسێك لەسەر دینی هاوڕێکەیەتی، جا هەریەك لەئێوە بزانن هاوڕێیەتی کێ دەکەن.

٣-هــاوڕێی چــاك عــەیب و كــەم و كورتییــەكانی ڕەوشت و كـردارت نیشـان ئـەدات و تـۆش هـەوڵ دەدەیـت نـەیهێڵیت، چـونكە پێغەمبـەر(ﷺ) دەفـەرموێت (المـؤمن مـرآة المـؤمن) رواه أبـودود (٤٩١٨) وحسـنه العراقـي وابـن حجـر والالباني في الصحيحة رقم (٩٢٦) وصحيح سنن أبي اود (٩٢٩/٣).

واتە: ئیماندار ئاوێنەی ئیمانداره.

٤-هـاوڕێی چـاك كۆمـەڵێك كەسـی تـری چـاكت پـێ دەناسێنێ و سوودمەند دەبیت لێیان.

٥-لـەڕێی هاوڕێیـەتی چاكانەوە كـەم وكورتی لایـەنی عیبادەتی خۆتت بۆ دەردەكەوێت. كاتێك خـۆت بـەراورد دەكەیت بەكردارو هەڵسوكەوتی ئـەو. وە هـەوڵ دەدەیـت چاكی بكەیت.

٦-بــــەهۆی هاوڕێیـــــەتی كردنــــی چــــاكانەوە دوور دەكەویتەوە لـەگوناه. گەرچـی بـۆ كـاتی بێت و لەبـەر شـەرم و ئەدەبت بێت لەو. چونكە ئەمـە وات لـێ دەكـات هـەوڵ بدەیت كاتێ ئەویشت لەگەڵ نییە هـەر خۆپارێز بیت و تـەنها لەبـەر خوای گەورە لەگوناهو تاوان دوركەویتەوە.

٧-هاوڕێی باش هەندێ شتت بیر دێنێتـەوە یـان فێـر دەكـات كەسـوودمەند دەبێـت لێـی وەك بیرخسـتنەوەی

هەنـدێك واجـب كەتەمبـەڵ بویـت لەئەنجامـدانی یـان هەندێ سوننەت كەبێ ئاگابویت لێی یان هەندی شتی حـەرام كـە بەبچـوكت زانیـوە. وەهانـت دەات لەسـەر ئەنجامدانی پڕۆژەی خەیری‌و چاك.

٨-تـۆ تەماشـای بـەرزی پلـەی زانسـت‌و عیبـادەت‌و بانگەوازو رەوشتی دەكـەیت‌و بـەراوردی دەكـەیت لەگـەڵ خۆتـدا تەماشـا دەكـەیت زۆر لـەپێش تۆوەیـە ئـەمیش لەدوو رووەوە سودی هەیە:-

أ-ئەو عوجب‌و سەرسامی‌یەی هەتە بەخۆت نامێنـێ. كە پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی عوجب دەفەرموێت: (**لو لم تكونوا تذنبون لخفت عليكم ماهو أشد من ذلك العجب العجب**) أخرجه القضاعي (١٤٤٧) والبزار وقال المنذري والهيثمي: إسناده جيده وحسنه الالباني في السلسة الصحيحة (٦٥٨).

واتـە: ئەگـەر گونـاهو تـاوان نەكـەن لەشـتێكی تـری گـەورەتر دەترسـم كەتوشـتان ببێـت ئـەویش عوجبە عوجب.

ب-وە دەبێتـە هـۆی ئـەوەی پێشـبڕكێ‌و مونافەسـە بكەیت لەگەڵی لەو كردارانەدا كەهەیەتی.

٩-هاوڕێیەتی کردنیان هۆی پاراستن و بەکارهێنانی کاتە لەخێردا. کاتیش بریتی‌یە لەژیانت.

١٠-هاوڕێی باش لەئامادەیی و پاش ملەتدا دەتپارێزێت و نهێنیت باس ناکات و حورمەتت لەکەدار ناکات و بەرگریت لێ دەکات.

١١-بەبینینی هاوڕێی باش و خواناس یادی خوای گەورەت دەکەوێتەوە. پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: (أولياء الله تعالى الذين إذا رؤوا ذكر الله تعالى) عزاه السيوطي في الجامع الصغير للحكيم عن ابن عباس مرفوعا. وحسنه الالباني في صحيح الجامع رقم (٢٥٥٧).

واتە: دۆستانی خوای گەورە ئەوانەن کاتێ دەیانبینی خوای گەورەت بیر دێتەوە.

موسای کوڕی عوقبە دەفەرموێت: (من جاری وا هەیە برایەکی موسڵمانی خۆم دەبینم، بەهۆیەوە چەندان ڕۆژ ژیرو بەفام دەبم) روضة العقلاء ص ٩٢.

١٢-هاوڕێی چاك ئاسوودەیی کاتی خۆش و دڵنەوایی و توێشووی کاتی بەڵاو ناڕەحەتین و حەل کەری گرفتەکانتن. ابن مسعود (ڕەزای خوای لێ بێت)

جارێکیان چووه ناو هاوەڵەکانیو فەرمووی: (أنتم جلاء حزني) روضة العقلاء ص ٩٢. واتە: ئێوه خەمڕەوێنی منن.

١٣–هاوڕیەتی کردنت بۆ چاکان هۆیەکە بۆئەوەی بچیتە ریزی ئەوانەی لەرۆژی دوایی‌دا ناترسنو خەم ناخۆن. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ الْأَخِلَّاءُ يَوْمَئِذٍ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلَّا الْمُتَّقِينَ، يَا عِبَادِ لا خَوْفٌ عَلَيْكُمُ الْيَوْمَ وَلا أَنْتُمْ تَحْزَنُونَ﴾ (الزخرف:٦٧–٦٨).

واتە: هاوڕێو دۆستانی دونیا لەڕۆژی دوایی‌دا دەبنە دوژمنی یەکتری جگە لەپارێزکاران، ئەی بەندەکانی من ئەمڕۆ ترستان لەسەر نی‌یەو خەم ناخۆن.

١٤–تۆ سودمەند دەبیت لەو پاڕانەوانەی کەبەنهێنی لەکاتی ژیانو دوای مردنتدا بۆتی دەکەن. چونکە رەوشتی پیاوچاك وایە دەپاڕێنەوه بۆ یەکتری. پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت (دعوة المرء المسلم لأخيه بظهر الغيب مستجابة. عند رأسه ملك موكل. كلما دعا لأخيه بخير قال الملك الموكل به: امين، ولك بمثل) رواه مسلم (٢٧٣٣).

واتە: پاڕانەوەی موسڵمان بۆ بری موسڵمانی بەنهێنی وەڵام دەدرێتەوەو گیرایە. لای سەری مەلائیکەتێك دانراوه

هـەركات بەچاكە بـۆ براكـەی دەپاڕێتـەوە. ئـەو مەلائیكەتـە دەفەرموێت: ئامین. بۆ خۆشت.

خــەتیبی بەغــدادی لــەبارەی ژیــانی طــەیبــی كــوڕی ئیسـماعیلەوە دەگێڕێتـەوە كەدەفتـەرێكی هـەبووە نـاوی سـێ سـەد هـاوڕێی خـۆی تێـدا تۆمـار كردبـوو هـەموو شـەوێك نەدەخـەوت تـا دەپاڕایـەوە بۆیـان، شـەوێكیان لـەبیری چـوو بپاڕێتـەوە بۆیـانو نوسـت. لەخـەودا پێیـان وت: ئـەی بـاوكی حەمـدان – كـە ئەمـە كونیەكـەی بـوو– ئەمشەو چراكەت دانەگیرساند. ئەویش لەخـەو راپـەڕیو هەسـتاو چـراكەی داگیرسـاندو دەفتەرەكـەی دەرهێنـاو یەك یەك بۆیان پاڕایەوە/ تأریخ بغداد ٩/٣٦١.

١٥–مەجلیسـی ئـەهلی چاكەخوازان شـەیتانی جینو ئینس لێی دەسڵەمێتەوەو نزیكی نابێتەوە بەپێچەوانەی مەجلیسـی خراپـەكاران. هـەر لەبـەر ئەمەشـە دەبینـی خراپــەكاران هــەردەم قەڵســن بــەوجۆرە مەجلیســانەو تابۆیـان بكرێـت نـاهێڵن كۆببنـەوەو پەرتـەوازەییان تـێ دەخـەن. پێغەمبـەر(ﷺ) دەفـەرموێت: (علیـك بالجماعـة

فإنما يأكل الـذئب القاصـية) أخرجه أحمد وأبوداود والنسائي وحسنه الالباني في صحيح سنن النسائي ١٨٤/١.

واته: پەیوەست بـە بەکۆمەڵـەوە چونکە گـورگ مـەڕی لاپەڕو لەمێگەل دەرچوو دەخوات.

١٦-دانیشـتن‌و هاوڕێیـەتی‌کردن‌و سـەردانی کردنـی پیاوچاکان لەبەر خوای گەورە هۆکاری بەدەست هێنـانی خۆشەویستی خوایە. پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: (خـوای گـەورە (تبـارك وتعـالى) دەفـەرموێت: (وجبـت محـبتي للمتحـابين في، والمتجالسـين في، والمتـزاورين في، والمتبـاذلين في) رواه مالـك ٩٥٣/٢ وصـحح اسـناده ابـن عبـدالبر والنووي والمنذري وقال الالباني: صحيح (صحيح الجامع رقم ٤٣٣١).

واته: خۆشەویستی من واجب بووە بۆ ئەو کەسانەی لەبەر من یەکتریان خۆش دەوێت‌و لەبـەر مـن لەگـەڵ یـەك دا دەنیشن‌و لەبـەر مـن سـەردانی یـەکتری دەکـەن‌و لەبـەر خـــاتری مـــن بەیـــەك دەبەخشـــن‌و دەســـتگیرۆیی یەکتر دەکەن.

١٧-مەجلیسـی پیاوچـاکان مەجلیسـی زیکرکردنـی خوای گەورەیەو سەرچاوەی بەدەست کەوتنی لێبوردنی

خوایه. پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: (ما جلس قوم يذكرون الله الا ناداهم مناد من السماء: قوموا مغفورا لكم) رواه أحمد وصححه الالباني في صحيح الجامع (٥٦٠٩).

واته: هیچ کۆمەڵێك نیيه که دابنیشن‌و یادی خوای گەوره بکەن، ئیلا بانگەوازکارێك لەئاسمانەوه بانگیان دەکات‌و دەفەرموێت: دەسا کاتێك هەڵدەستن خوای گەوره لێتان خۆش بووه.

١٨-مرۆڤ کاتێ لەبەر خوای گەوره سەردانی براکانی دەکات دەروونی ئارام دەبێت‌و پلەی گەورەی لەبەهەشت دا بەنسیب دەبێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: (ما من عبد أتى أخاه يزوره في الله إلا ناداه مناد من السماء: أن طبت وطابت لك الجنة. وإلا قال الله في ملكوت عرشه: عبدي زار في وعلي قراه فلم يرض له بثواب دون الجنة) رواه البزار وأبو يعلى قال المنذري والدمياطي: رواه البزار وأبو يعلى باسناد جيد وقال الهيثمي في مجمع الزوائد (١٧٣/٨): رواه البزار وأبو يعلى ورجال ابي يعلى رجال الصحيح غير ميمون بن عجلان وهو ثقة.

واته: هیچ عەبدێك نیيه که لەبەر خوا سەردانی براکەی دەکات، ئیلا بانگەوازکارێك لەئاسمانەوه بانگی

دەكاتو دەفەرموێت: دەرونت پاكو ئارامو بەهەشتت بۆ ڕازاوە بێت. خوای گەورەش لەسەر عەرشەكەیەوە دەفەرموێت: بەندەكەی من لەبەر منو بۆ من سەردانی كردو لێی ڕازییەو بەهیچ پاداشتێك ڕازی نابێت بۆی جگە لەبەهەشت.

جا بەداخەوە جاری وا هەیە موسڵمانێك نەخۆش دەكەوێت یان توشی بەڵایەك دەبێت كەچی موسڵمانان سەردانی ناكەن. بێ ئاگا لەم فەرموودانە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: (إذا عاد الرجل أخاه المسلم مشى في خرافة الجنة حتى يجلس فإذا جلس غمرته الرحمة، فإن كان غدوة صلى عليه سبعون ألف ملك حتى يمسي، وإن كان مساء صلى عليه سبعون الف ملك حتى يصبح) رواه الترمذي وابن ماجه وأحمد وانظر صحيح ابن ماجه ٢٤٤/١ وصحيح الترمذي ٢٨٦/١ وصححه أيضا أحمد شاكر.

واتە: كاتی موسڵمانێك سەردانی برایەكی نەخۆشی دەكات بەناو باخێكی بەهەشت دا هەنگاو دەنێ هەتا دەگاتە ئەوێو دادەنیشێ، جا كاتێ دانیشت بەزەیی خوایی دایدەگرێتەوە. ئەگەر بەیانی بوو حەفتا هەزار

مەلائیکەت بۆی دەپاڕێنەوە تا ئێوارە. وە ئەگەر ئێوارە بوو حەفتا هەزار مەلائیکەت بۆی دەپاڕێنەوە هەتا بەیانی.

هەروەها دەفەرموێت: (ما من مؤمن یعزی أخاه بمصیبة إلا کساه الله سبحانه من حلل الکرامة یوم القیامة) أخرجه ابن ماجه وقال النووي: أسناده حسن. وحسنه الالباني في صحیح سنن ابن ماجه (١٣٠١).

واتە: هیچ ئیمانداریێك نییە کەسەرەخۆشی موسیبەتێك لەبرایەکی خۆی بکات ئیلا خوای گەورە لەڕۆژی دواییدا بەرگو خشڵی ڕێزی بە بەردا دەکات.

١٩-جا دانیشتنو هاوڕێیەتی کردنی پیاوچاکان لەهەموو روویەکی دینو دونیاوە سوودمەندییە. پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: (المؤمن إن ماشیته نفعك، وإن شاورته نفعك، وإن شارکته نفعك، وکل شيء من أمره منفعة) رواه أبو نعیم في الحلیة ٨/١٢٩ وقال: ثابت صحیح عن النبي ρ من حدیث ابن عمر.

واتە: ئیماندار ئەگەر لەگەڵی بڕۆیت بەڕێدا سوودت پێ دەگەیەنێت. وە ئەگەر راوێژی پێ بکەیت سودمەند

دەبیت. وە ئەگەر بەشداری پێ بکەیت لەکارێکداو ببیتە شەریك لەگەڵی سودی لیٚ دەبینی. وە هەموو شتێکی ئیماندار بەسوودی‌یە.

٢٠-هاوڕێیەتی‌کردنی پیاوچاکان دەبێتە هۆی دروست بوونی خۆشەویستیان لەبەر خوا.کە ئەمیش زۆر پاداشتو بەرهەمی هەیە لەوانە: بەهۆی خۆشویستنی خواناسانەوە دەبیتە خۆشەویستی خوا، وە دەبیتە کەسێك کە لەڕۆژی قیامەتدا لەژێر سێبەری عەرشدایت. وە نیشانەی کاملی ئیمانو نیشانەی چێژکردنی شیرینی‌یەتی. وە دەبیتە کەسێك کە خوای گەورە ڕێزت لیٚ دەگرێتو ئیمانو زانستو کردەوەی چاكو نیعمەتت پیٚ دەبەخشێتو لەڕۆژی دوایی‌دا دەخرێیتە سەر مینبەری نورینو لەقیامەتدا لەگەڵ ئەوان حەشر دەکرێیت. لەئەنەسەوە دەفەرموێت: پیاوێك پرسیاری لەپێغەمبەری خوا کرد(ﷺ) : کەی قیامەتە؟ ئەویش فەرموی: چیت بۆ ئامادە کردووە؟ ئەویش وتی: لەڕاستی‌دا نوێژو ڕۆژوو خێری زۆرم بۆ ئامادە

نەکردووە. بەڵام ئەوەندە هەیە خواو پێغەمبەری خوام خۆش دەوێت. پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (أنت مع من أحببت) تۆ لەقیامەتدا لەگەڵ ئەو کەسەدایت کە لەدونیادا خۆشویستووە. جا ئەنەس فەرمووی: جا بەهیچ وتەیەك بەئەندازەی ئەم فەرمودەیەی (تۆ لەقیامەتدا لەگەڵ ئەو کەسەدایت کەخۆشت ویستووە) خۆشحاڵ نەبوین. چونکە من پێغەمبەری خوا(ﷺ)و ئەبوبەکرو عومەرم خۆش دەوێت و ئومێدەوارم بەهۆی ئەو خۆشەویستەم بۆیان لەقیامەتدا لەگەڵیان بم. گەرچی بەوێنەی کرداری چاکی ئەوانیشم نییە) رواه البخاري (٣٦٨٨) ومسلم (٢٦٣٩).

# زیانەکانی هاوڕێیی خراپ

١-هاوڕێی خراپ دەبێتە هۆی دروست کردنی گومان لەبیروباوەڕتـــداو گومڕاکردنـــت: لەموســـەیبی کـــوڕی حەزنەوە دەفەرموێت: کاتێ ئەبا طالب لەسەرەمەرگی دا بـوو پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) سـەردانی کـرد بینـی (ئـەبا جـەهلی کـوری هشـامو عەبـدوڵڵا کـوری ئومەییــەی موغـەیرەی) لەلایـە. فـەرموی: ئـەی مامـە بڵـێ (لا الـه الا الله) وشەیەکەو دەیکەمە شاهێد بۆت لای خوای گەورە. ئـەبو جـەهل و عەبـدوڵڵای کـوڕی ئومەییـەش دەیـانوت: ئــەی ئــەبا طــالــب ئایــا پشــت لــەدینو میللــەتی عەبدولموتەلیب دەکەیت؟! جا بەردەوام پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) لێی دووبارە دەرکردەوەو ئـەوانیش ئـەم وتەیـەیان دەدا بەگوێدا تـا ئـەوەبوو کۆتـا وشـەی ئـەبو طـالـب ئـەوە بـوو کـە: لەسـەر میللـەتی عەبدولموتـەلیب دەمـرم، وە نەیوت لا اله الا الله) رواه البخاري (١٣٦٠) و مسلم (٣٤).

٢-هـاوڕێی خـراپ بانگـت دەکـات بـۆ ئەنجامـدانی خراپـەو تـاوان وەك خـۆی. جا لەبـەر ئـەوە بێت تـا کـەتۆ بەچاك نەناسرێیتو لەو باشتر بیت، یان نەبیتـە شاهید

لەسەر خراپەکانی و باسی بکەیت، یان ببێتە منەتبارت.
عوسمـان (ڕەزای خـوای لـێ بێـت) دەفـەرموێت: (ودت الزانية لو زنى النساء كلهن) فتاوى شيخ الاسلام ٢٨/١٥٠-١٥١.
واتـە: ئافرەتی زیناکەری داوێـن پـیس ئاواتـە خـوازە سەرجەم ئافرەتان داوێن پیس و زیناکار بن.
٣-مـــرۆڤ بەهاوڕێیـــەتی کردنیـــان بەشـــێوەیەکی سروشتی خووڕەوشت و کردەوەی ئەوان دەگرێت.
٤-بــــەبینینیان گونــــاه و سەرپێچــــی خــــوای گەورەت بیر دێتەوە.
٥-هـاوڕێی خـراپ کۆمەڵـە کەسـانێکی وەك خـۆی و بگــرە خــراپترت پــێ دەناســێنێ و دەبیتــە هــاوڕێی کەسانێکی خراپەکارتری زیاتر.
٦-عەیبـەکانت لابـاس ناکـات تـا چـاکی بکـەیت و گوناهەکانت لەلا جوان دەکات و شیرین و ئاسانی دەکات لەبەرچاوت.
٧-بـەهۆی هاوڕێیـەتی کردنیـەوە بـێ بـەش دەبیـت لەهاوڕێیەتی کردنی پیاو چاکان. جا بەهۆی ڕۆچونت بێت لەئارەزووبازیدا یان لەبەرئەوەی هاوڕێکەت ڕێت

پـێ نـادات، یـان لەبەرئـەوەی شـەرم دەکـەیت بچیتە نـاو پیاوچاکان. لەکاتێکدا دەزانن تۆ حاڵت ئاوایە.

٨-کردەوەکانت دەپێوی بەکردارەکانی ئەو بەو، وە بەو هۆیەوە زیاتر ڕۆدەچیت لەیاخی بوون‌و، کەوتنە ناو گوناهو کەمتەرخەمی کردن لەچاکەدا، یان هیچ نەبێت تووشی عوجب دەبیت بەخۆت.

٩-مەجلیسـەکانیان پـڕە لـەگوناهی وەك شـیرك‌و غەیبەت‌و باسی خەڵك‌و درۆو جوێن‌و گۆرانی‌و .. هتد. تۆش دەبیتە بەشداری گوناهیان.

١٠-هاوڕێیـەتی کردنیـان سـەرەنجامی جیابونەوەیـە لەگـەڵ دروسـت بـوونی بچـوکترین نـاکۆکی‌و زاڵ بـوونی بەرژەوەندی‌دا...

١١-خـۆ ئەگـەر لـەدونیادا بـەردەوام بـوو ئـەوا لەقیامەتـدا ئەم دۆستایەتی‌یە دەبێتە دوژمنایەتی وەك پێشتر باس کرا.

١٢-مەجلیسـەکانیان لەبەرئـەوەی یـادی خـوای تێـدا ناکرێـت. لەقیامەتـدا دەبێتـە بەشـیمانی‌و ئـاخ‌و حەسرەت بۆیان.

**١٣–بەهۆی هاوڕێیەتی کردنیانەوە کاتت دەفەوتێت. ئەوکاتەی کەلێپرسینەوەی قورسی لەسەرە لەقیامەتدا.**

**١٤–تۆ بەوەوە دەناسرێیت و دەبیتە جێگای گومانی خراپی خەڵکی لەبەرئەوەی هاوڕێیەتی خراپەکاران دەکەیت، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: (لاتصاحب إلا مؤمنا ولا يأكل طعامك إلا تقي).** رواه أحمد والترمذي (٢٣٩٥) وأبوداود وحسنه الترمذي والبغوي وابن مفلح.

**واتە: تەنها هاوڕێیەتی ئیماندار بکەو با تەنها پارێزکاران لەخواردنت بخۆن.**

**ئەبوداود دەفەرموێت: (ئەگەر سێ شت نەبوایە حەزم دەکرد لەناو سکی زەوی‌دا بومایە نەك لەسەر پشتی: ئەگەر برایانێك نەبونایە قسەی جوان و شیرینم بۆ دەهێنن وەك خورمای شیرین. وە لەبەرئەوەی ناو چاوم دەخەمە سەر زەوی و کڕنوش دەبەم بۆ خوا. وەبەیانی و ئێوارە بەسەر بردن لەپێناوی خوای گەورە لەمەیدانی جیهاددا/** الزهد للامام أحمد ص ١٣٥.

وآخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمين

سەرچاوە/(من تجالس) عبدالله بن علي الجعيثن

زنجیرەی پەروەردەیی:

١- سوودەکانی هاورێیەتی پیاوچاکان.

٢- بڵاوبوونەوەی داوێن پیسی..هۆکارو چارەسەر.

٣- دیاردەی مەی خواردنەوە لە ناو گەنجاندا.

٤- دامەزراوی.

٥- زمانت بە یادی خوای گەورە پاراو بکە.

٦- نوێژی جەماعەت و هامشۆکردنی مزگەوت.

٧- بۆ خوشکێکی لەچکە بەسەر لەم مانگەدا.

٨- تاقی کردنەوەی خوای گەورە حەتمی‌یە.

٩- دیاردەی ساردبوونەوە لە دین.

١٠- پێغەمبـــەری خۆشەویســـت(ﷺ) وەك ئـــەوەی ببیبینی.